# وەڵامی بانگەوازی خوابرەنەوە

## نامەیەکی کورت
## لەئایەتێکی دەبڕگەیی بۆ گەلەکەم

شەرحکردنی

مامۆستا کامەران کەریم رحمه الله

نووسینەوە و ئامادەکردنی

زانستخوازێکی شەرعی

بسم الله الرحمن الرحيم

بسم الحمد لله والصلاة والسلام على رسول لله وعلى اله وصحبه ومن واله إما بعد :

سەرەتا سوپاس و ستایش بۆ الله تعالی کە یارمەتی داین بۆ ئەم ڕێگای ڕاستە کە بریتیە لە تەوحید و ئیمان و یەکخوا پەرستی ، جا لەدوای ئەم نیعمەتە کە الله تعالی بەندەکانی بەخشیوە یەکێکیتر لەنیعمەتەکانی زانست و زانیارییەکەیەتی کە بەخشیویەتی بە بەندە صالحەکانی لەسەرووی هەموویانەوە نێردراوی خۆیی کە پێغەمبەر محمدە ﷺ ئەویش بەحەق وبەراستی پەیامەکەی گەیاندوە و گەیشتوە بەئێمە پۆل بەپۆل جا ، الله تعالی بەخششی بەمنی تاوانبار بەخشی هەلسەم بە کۆکردنەوەی ئەم بابەتە کە لەدەرسێکی مامۆستای خۆشەویستمان کامەران کەریم (ڕەحمەتی الله تعالی لێ بێت) هەلساوە بەجوان و بەرێکی وبە راستگۆیەکی زۆر بەبوێرانەوە ئەم بابەتی گەیاندوە بەگەلەکەی تاوەکو ببێتە حوجە و بورهان لەسەریان و بگەڕێنەوە بۆسەر ڕێگای ڕاست .

لێرەدا مامۆستای خۆشەویستمان هەلساوە بەتەفسیر کردنی ئایەتێك لەئایەتەکانی قورئان جا ئەم ئایەتە زۆر گەورە و عەزیمە کە ئایەتی ١٥ سورەتی الشورى یە ، کە ئەم ئایەتە پێك هاتووە لە دەبرگە واتا لەیەك ئایەت دا دەبرگەی تێدا هاتوە هەر یەکێکی پەیوەستە بەئەویترەوە و تێدای باسی ئیسلامەتی و یەکخوا پەرستی دەکا هۆکاری ناردنی پێغەمبەران و ئەو وەحییەی کە بۆ پێغەمبەران هاتووە (عليهم الصلاة والسلام) .

داوا کارین لە الله تعالی یارمەتی دەری هەموو لایەك بێت بۆ ئەوەی بتوانن بگەن بەرێگاکانی گەیشتن بەناسینی الله تعالی و پەیامەکەی کە ئیسلامە .

(وصلى الله على نبينا محمد وعلى اله وصحبه أجمعين)

زانست خوازێکی شەرعی

٢٦\رەجەبی ١٤٤١

الله تعالى دەفەرمووێی :

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ١٥﴾[1]

<u>ماناى ئایەتەکان :</u>

إبن كثير وەصفێکی ئەم ئایەتەمان بۆ دەکات و دەفەرمووێی : (اشتملت هذه الآية الكريمة على عشر كلمات مستقلات) زۆر ورد ببنەوە لەم ئایەتەی کە ئێستا باسی ئەکەین ، چونکە دەفەرمووێی : ئەم ئایەتە لەسەر دە بەرگەی سەر بەخۆ پێك هاتووە ، (كل منها منفصلة عن التي قبلها)هەر یەك لەبرگەکان جیاوازە لەوەی پێش خۆیدا ، (حكم برأسه)هەریەکە و حوکمێکی خۆیی هەیە ، (قالوا : ولا نظير لها سوى آية الكرسي)دەفەرمووێی : ئەم ئایەتە وێنەی ئەم ئایەتە هەرنیە إلا ئایەتی الکرسی نەبێت کە ئەویش دەبرگەیە ، ئەگەر سەرنجتان دابێت کە ئەویش دەبرگەیە ، بەڵام بەداخەوە خەلکی بەس دەیلێت ئاگای لەماناکەی نیە وە ئاگای لەحوکمی ماناکەی نیە وە ئاگای لە عەمەل بە ماناکەی نیە ، زۆر بەدەگەمن هەیە کەوا ئایەتی الکرسی لەبەر نەبێت ! چونکە ئەزانن ئایەتی الکرسی یەکەم گەورەترین ئایەتە لەقورئاندا ، پاشان ئەو حەدیثانەی کە لەسەری هاتوە کە تەصحیح کراوە هەر کەسێك ئایەتی الکرسی لەدوای نوێژەکان بخوێنی ئەوە لەنێوان ئەو و بەهەشتدا بەس مردن لەنێوانیاندایە بمرێی و ئەچێتە بەهەشت ، بەڵام ئاگاداربن بەس بە خوێندنەوەکەی نیە بەلکو بەعەمەل کردنە بە ئایەتەکە .(فإنها أيضا عشرة فصول كهذه .)ئینجا دەفەرمووێی : ئایەتی الکرسیش دەبرگەیە وەکو ئەم ئایەتەی سورەتی الشورى .

---

[1] .

# برگەیەی یەکەم

( قوله (فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُ ) أي : فللذي أوحينا إليك من الدين الذي وصينا به جميع المرسلين قبلك أصحاب الشرائع الكبار المتبعة كأولي العزم وغيرهم ، فادع الناس إليه .) واتا : ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾بۆ ئەو دینەی کە ئێمە وەحیمان بۆتۆ کردوە کە هەموو پێغەمبەرانمان پێی راسپاردە کردوە و پێی ناردوە و پێی وەصیەت کردوە وە تۆش دەعوە بۆ ئەو دینە بکە کە دەبێت تەنها الله تعالی بپەرسترێت .

بەڵام بەداخەوە ئەمرۆ هەلبژاردن و ئینتخاباتە بگەرێنەوە بۆلای گەل !! خوامان بۆ چیە ! ئایا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئێستا ئەگەر لەژیاندا بوایە ئەگەرایەوە بۆلای گەل یاخود بۆ لای الله تعالی !؟ یان ئەگەرایەوە بۆ ئەهوا و ئارەزووی خەلکی یان شەریعەتەکەی الله تعالی؟! ئایا پێت وایە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ئەچوە ناو پەلەمانەوە و ئەیوت سوێند بەو قورئان من بەقسەی ئەم قورئانە نەکەم و بەقسەی دەستور بکەم ؟! ئایا وای دەوت ؟! ئێستا هەموو پەرلەمانتارەکان وادەلێن : یاخود نا ؟! بەئیسلامی و غەیری ئیسلامیشەوە ئەلێن : سوێند بێت بەم قورئانە پارێزگاری لەم دەستورە بکەم ! ئایا دەستور وەحیەکەی پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾کە بۆی هاتووە ؟! یاخود ئەهوا و ئارەزووی خەلکی دانراوە ؟! ئایا پێغەمبەر وا دەلێ ﴿ﷺ﴾؟

کەواتە کە تۆ نوێنەرێك بۆخۆت دائەنێت یانی تۆ رازیت کە ئەو کەسە لەجیاتی تۆ سوێند بخوات لەوێدا ، الله تعالی دەفەرموێ : (فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُ ) الله تعالی نالێت : (للهؤاء فادع) بۆیە لەدوای ئەوە دەفەرموێت الله تعالی .

*** ***

## برگەی دووەم

(وقوله : ﴿وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ﴾ )ئەها چەند قورسە ئەم کەلیمەیە ، تۆ ئیستقامەت هەبی وە لەسەر ئەم دینە برۆیی وە لانەدەی وە راست و چەپی لەسەر نەکەیت وە بەقسەی کەس نەکەیت تەنها تۆ دەبێت بەقسەی الله تعالى بکەیت ، ئیتر چی روو دەدا با رووبدا ئەکوژرای و سەرنەدەکەوتی لەدونیا !! ئێستا بەخەلکەکەوا بلێ پێت ئەلێ : ئاخر ئەگەر وابکەین سەرناکەوین !؟ بۆتۆ ئەزانی بەشیرك و گومرایی سەرکەوتی !! الله تعالى دەفەرمووێ : (﴿إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ﴾)[1] لەکاتێکدا کەباسی دوو کارە باشەکەمان بۆ دەکا (إما النصر وإما الشهادة) شەهادە ئەوەیە لەسەر ئەم رێگەیە برۆیی وە دینەکە سەربخەی (﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ﴾)[2] سوێند دەخوا الله تعالى بەخۆیی دەفەرمووێ : والله سوێند بێت بەمن هەر کەسێك من سەرخا من سەری دەخەم ، ئەی ئەگەر خەلکت سەرخست ؟! ئەوە بەدلنیایەوە بەبێ گومانی کەوا سەرناکەویی .

کەواتە :( ﴿وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ﴾ ) أي : واستقم أنت ومن اتبعك على عبادة الله) لا مەدەن لە دینەکەی الله تعالى ، کەچی ئەمرۆ لادانە و هەمووی ئینحرافاتە لەدینەکەی ،( كما أمركم الله عز وجل .) بەداخەوە زۆر بەداخەوە ئەوەتا موسلمانان لە ئەحزابی بەناو ئیسلامیدا ئەلێ : دەستور با سەروەر بێت ، ئادەی وەرە دەستور قورئانە ؟! دەستور قورئانی خوایە تاوەکو سەروەر بێت یان ئەهوا و ئارەزوی ئینسانەکانە ؟! تۆ نازانی بەم کەلیمەیە تۆ خۆت کافر کرد !! تۆنازانی شەریکەت پەیاکرد بۆ دینەکەی الله تعالى !؟ .

*** ***

[1] :سورة التوبة ، اية : ٥٢.
[2] :سورة الحج ، اية : ٤٠.

## برگەی سێ یەم

(وقوله : وَلَاتَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ) ئایا رەئی شەعب و گەل ئەهوا و ئارەزووە یان قسەی الله تعالى یە ؟! ئێوە ئەوەم جواب بدەنەوە ؟! واللە ئەهوا و ویست وئارەزووەکانی ئینسانەکانە ، کەچی الله تعالى بەپێغەمبەر محمد ﷺدەفەرمووێی : (وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ) شوێن هەوا و ئارەزووی خەلکی مەکەوە ،( يعني : المشركين فيما اختلقوه ، وكذبوه وافتروه من عبادة الأوثان .) واتا ئەو موشریکانەی ، لەوانەیە بەس ئەبو جەهل بەلاتەوە موشریك بێت ! تۆ بیر لە حالی ئەبو جەهل بکەرەوە ئەو حەجی ئەکرد وە بەرۆژوو ئەبوو وە عیبادەتی ئەکرد وە صەدەقەی ئەکرد و ئاوی حاجیەکانی ئەدا وە بۆخواشی ئەکرد بە حیسابی خۆیی بەلاّم لەهەمان کاتیشدا بۆلات و عوزاشی ئەکرد ئەوە شەریکایەتیەکەی ئەو بوو ، ئەی ئەوانەی ئەمرۆ هیچیان لەو کەمترە ؟! نەخێر بەلکو حالیان لەو خراپتریشە نەك کەمتر لەشیرك و کوفرەکەیاندا .

کەواتە ئەی محمد ﷺتۆ شوێن ئەهوا و ئارەزوەکانیان مەکەوە لەوەی کەوا دروستیان کردوە و هەلیان بەستوە بەدرۆوە هاتوون دەستورێك و یاسایەك و شەریعەتێکیان داناوە ئەیانەویی خەلکی لەسەری بڕوا تۆ شوێن ئەوە مەکەوە .

*** ***

# برگەی چوارەم

(وقوله : ﴿وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖ﴾ ) تۆ بلێ ئەی محمد ﷺ وە هەروەها شوێنکەوتوانت ئێمە ئیمانمان هەیە بەهەر کیتابێك کە الله تعالی ناردبێتیە خوارەوە کە لەلای الله تعالی وە هاتووە ، (أي : صدقت بجميع الكتب المنزلة من السماء على الأنبياء لا نفرق بين أحد منهم .) ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوان عیسا و موسا ئیبراهیم و نوح و ئادەم و هەموو پێغەمبەران کە هاتووە هەموویان پێغەمبەرانی الله تعالی بوون وە بۆیەك ئامانج هاتوون ، کە ئەویش ئەوەیە دەبێت الله تعالی بپەرسترێت ،بەڵام لەلایەنی شەریعەتەوە الله تعالی هەموو شەریعەتەکانی نەسخ کردوە (واتا لایبردوە و هەلیگرتوە )تەنها دینی پێغەمبەر محمد نەبێ ﷺدەبێت موسا و عیسا و هەموو پێغەمبەرانیتر ئەگەر ئێستا لەسەر ژیاندا بن دەبێت شوێن ئەم شەریعەتی پێغەمبەر محمد ﷺبکەون وە بۆیان نیە شوێن شەریعەتەکەی خۆیان بکەون ، ئیمان هەموو یەکە .

لەبەر ئەوە إبن كثير لە باسی جەنگیز خاندا دەفەرمووێی : (ئەگەر کەسێك بێت دینی پێغەمبەر محمد ﷺلابدا وە دیانەتی موسا وعیسا بهێنی ئەوە ئەو کەسە کافرە )[1] کە بەحیساب ئەوە دینی خوایە وە لەسەر دینی پێغەمبەرانی پیشوتر دەروا !! ئەی ئەگەر لەسەر ئەهوا و ئارەزووی خەلکانیتر بکات ؟! یاخود یاسای جەنگیز خان جێ بەجێ بکات إبن كثير دەفەرمووێی : بەکۆ دەنگی زانایان ئەو کەسە کافرە .

کەچی ئەمرۆ کەسانێك بەداخەوە دێن شك و گومان ئەبەن ئەگەر بێتوو بێن دەستورێکمان بۆ دابنێین ئەگەر ئەو کەسە بلێت : لا اله الا الله ئەگەر دەستوریشی دانا پێی نالێن کافر و دەلێن : ئەوە موسلمانە لەبەر ئەوەی دەلێت : لا اله الا الله ! ئی خۆ یەهودیش دەلێت : لا اله الا الله .

[1] : البداية والنهاية .

ئێستاكە ئێمە قورئان و حەدیث لائەبەین ئەچین ئینجیل ئەهێنێن ئایا ئەوە دروستە لای الله تعالی ؟! ئی ئەوە الله تعالی ناردوویەتیە خوارەوە ئەوەش نا كە تحریف كراوە هەتاوەكو ئێستا تەوارت و ئینجیلە راستەقینەكە بێنە نابێت تۆ ئێستا حوكمی پێی بكەیت لەلایەنی شەریعەتەوە بەلكو دەبێت تۆ حوكم بەم قورئانە بكەیت ، الله تعالی دەفەرمووێی : (وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ )[1] ئایەتەكە صەریحە.

*** ***

## برگەی پێنجەم

(وقوله : وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ) یانی بەراستی دەبرگەیە یەك لەیەك گرینگترە چەندی ئینسان ورد بێتەوە لێی هێشتان كەمە تاوەكو تدبوری تێدا بكەیت ئەلێ( وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ) أي : في الحكم)من ئەمرم پێكراوە كەوا حوكمرانی ئێوە بكەم .

حوكمرانی كردن یانی چی ؟ یانی ئەو پێغەمبەرە ﷺبێت بە سەرۆكی موسلمانان لەناو واقیعدا دەبێت حوكمەتێك و دەولەتێك پێك بهێنی وە ئەم دەولەتە بەئەمری الله تعالی بروات بەرێوە ،( أي : في الحكم كما أمرني الله .).

كەواتە لێرەدا با رەدی ئەو عەلمانی و ئەولیبرالی و ئەو دونیاویانە بدەینەوە با رەدی ئەو دونیا پەرستانە بدەینەوە كە دێن بەموسلمان ئەلێن : با مامۆستای ئاینی باسی سیاسەت نەكات وە با موسلمانان باسی سیاسەت نەكەن ! جەنابت باسی بكەیت و بە هەوا و ئارەزووی خۆت بەزینا و ئارەق خواردن و بەكوشتن و برین لەپێناو پاراستنی خۆت و عەشیرەتی خۆت كە ملیۆن ملیۆن قات و قر بكەی وەك لە هەر دوو جەنگە جیهانیەكە كردیان ئاساییە !! بەس ئەگەر یەكێك بێت لەسەر دینی الله تعالی ئەوە كە الله تعالی بەتەویی وتوە ئەو دینە جێ بەجێ بكە

[1] : سورة المائدة ، اية : ٤٤.

حوكمەتێك پێك بهێنە لەسەر ئەساسی ئەم دینە !! ئەوانیش پێی دەڵێن : تیرۆست و ئیرهابی و چ جۆرە ناوێك هەیە لێی بنێ ! ئایا الله تعالی بەمە رازییە ؟! ئەڵێن : ئیسلامی سیاسی !! ئایا ئیسلامێکمان هەیە سیاسەتی تێدا نەبێت !؟ ئەی ئەو ئایەتە بچێتە بەناو چاوتدا چی لێ ئەکەیت ؟ کە الله تعالی دەفەرمووێ :(وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ)من ئەمرم پێکراوە کە عەدالەت بنوێنم لەسەر ئەم زەوییەدا ، ئایا عەدالەت بەبێ حوکم کردن دەبێت ؟!

(أي : في الحكم كما أمرني الله .) الله تبارك وتعالى ئەمری پێکردوم کەوا دەبێت من عەدالەت بنوێنم .

جا ئەم کەلیمەیە زۆر هەڵدەگرێت زۆر ، یانی ئەمریکا دەبێ بۆخۆی حوکمران بێ لەسەر زەویدا نابێ کەسیتر حوکمران بێ !! وە نابێت موسڵمان حوکمران بێت وە نابێت قورئان حوکمران بێت ،بەس هەوا و ئارەزوەکانی خۆیان با حوکمران بێ لەهەموو دونیا نەوەویشی هەبێ کێشە نیە وەدونیاشی پێ ئیبادە بکات هیچ کێشەنیە ، بەس موسڵمان کە چەکێکی هەبێت الله تعالی پێ وتوە (وَقَٰتِلُوهُمۡ)[1] ئەمە قسەی الله تعالی یان ئینسانە ؟! دەوەرە خۆت یەکلای بکەرەوە بۆچی قیتالت کردوە !! قیتالی لەپێناوی الله تعالی لەخەلکی کردوە بە وەحشیگەرێەتی و ئەژدیا !!بەس بەخۆت هەزاران چەکی کوشندەت هەبێ هەرچی پێ بکەی وەدونیاشی پێ تێك بدەی هیچ کێشە نیە لەپێناوی چیشدا ؟! لەپێناوی هەوا و ئارەزوەکانیدا !!

بەس تۆی موسڵمان لەپێناوی یەکخوا پەرستیدا کە ئەمە واجبی سەرشانی هەموو لایەکە ، ئەبێت خۆت بکەیت بە قوربانی الله تعالی ، من پرسیارێك لە موسڵمانان ئەکەم بەهەریەکێکیان ئەم عیبارەتە بلێ ! بلێ وەرە ئەبی بەقوربانی الله تعالی یان نا ؟! وەلام ئەداتەوە و دەڵێت : هەزار جار بەقوربانی الله بم !! بەس بلێ وەرە با لەپێناوی الله تعالی دا با هەوڵ بدەین و الله

[1] :سورة الأنفال ، اية : ٣٩

تعالی سەرخەین !! ئەڵێ : ئەوە نابێت ئەوە تیرۆرستیە !! ئی تۆ وتت من دەبم بەقوربانی الله !! ئی چۆن بەقوربانی دەبی ! ئی تۆ درۆت کرد ئەمە بەقوربانبوون نیە .

جا تەبعەن دەبێت ئاگاداربین ئەبێت ئێمە بگەڕێنەوە سەر قورئان ، قورئان باسی قیتالی تێدایە یاخود نا ؟! قورئان قیتالی واجب کردوە یان نا !؟ بەڵێ ڕێگەی داوە و واجبی کردوە بەڵام ئەمە بەهەرەمەکی نیە پێویستە لەپێناوی الله تعالی دا بێت وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ)کردی ، پێغەمبەری خوا (ﷺ)لەبەدەردا لەکافرانی قوریشی دا ، وە ئەگەر ئەمە ئێستا بووایە نەتەوە یەکگرتوەکان دەیانوت محمد تیرۆرستە وە موسیلمەکانیش وایان وتوە !! یەك لە موستەشریقەکان نوسیویەتی ئەمە هەموو وتەی ئەوانەیە کەوا ئێستا ئەوانەی ناوە خۆشیان ئەیلێنەوە : ئەڵێ پیغەمبەر (ﷺ) خوا لەناو دەمی ئەم موستەشریقە بدا ئەڵێ : (لەمەککە هیچی بۆ نەکرا لەبەر ئەوەی مەککەیەکان بەلیغ و فصیح بوون ئەو هات قورئانێکی هەڵبەست ئەی وت ئی خوایە راستیشی نەئەکرد ئی خوا نەبوو بەس بۆخۆیی فەصاحەت و بەلاغەتی ئاوابوو وە فصیح و بەلیغەکانی مەککە زۆر لەو بەلیغتر بوون لەتاوا جێی نەبوویەوە لەناویان رایکرد ، چوو بۆ مەدینە لەویدا کەوتە چەتەی لەسەریان وە شمشێریی بەکار هێنا بەحوجە و بورهان زاڵ نەبوو بەسەریاندا هات بە شمشێر لەبەدردا لێدان ) ئێستاش واناڵێن !!

ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ)وای کرد !؟ ئەگەر وای بکردایە ئەوە لەمەککە وای دەکرد لەمککە صەحابەکان خۆیان فیدای پێغەمبەری خوا (ﷺ)کردبوو دەیانوت :ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئێمە هەتاوەکو کەی ئاوا دابنیشین ئاوا !؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی : الله تعالی ئەمری پێنەکردووم .

بەڵام کە چوو بۆ مەدینە الله تعالی ئەمری قیتالی پێکرد الله تعالی دەفەرموێی : (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾)[١] بۆیە دەستی پێکرد وە لەدواتردا واجبی کرد لەسەریان الله تعالی فەرمووێی : (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ)[٢] ئەمە

---

[١] :سورة الحج ، اية : ٣٩.
[٢] :سورة التوبة ، اية : ٧٣.

ئەمری الله تعالی یە ، کەچی ئێستا ئەم ئەمرەی الله تعالی بۆتە حەرام وە واجب بۆتە حەرام ، جیهاد کە واجبە بۆتە حەرام وئەڵێن نابێت بیکەیت !! بۆیە ئەم ئومەتە هەر بەزەلیلی ئەمێنێتەوە هەر دەبی بەس بخۆین و بخەوین هەر با ئەمریکا گەورەی عالەم بێ !! تۆ ئێستا سەیری نەتەوە یەکگرتوەکان بکە شەش دەولەتی تێدایە لە ئەنجومەنی ئاسایش ئەگەر دونیا بلێ دەبێت ئەم شتە بکرێ ئەگەر ئەم شەش دەولەتە یەکێکیان وتی نا وانابێت بەقسەی ئەو دەکەن !! خوا و پێغەمبەر چی ئەڵێن با بلێن کێشە نیە ، تۆ سەیر بکە کوشتن و کوشتاری هەر موسلمانێك لەم سەر زەوییە کە ئەکرێت هیچ کاتێك دیفاعیان لی ناکەن !

بەهیچ شێوەیەك ئێمە ئەو پرسیارە ناکەین چونکە زۆر کەس ئەو پرسیارە دەکا بۆچی دیفاعیان لی ناکرێ !؟ ئەم پرسیارە لەوەوە دەکرێ ئەگەرئێمە بلێن ئەوانە خەمخۆری موسلمانان بەس ئێمە دەزانین کەوا ئەوانە دووژمنی موسلمانان چۆن لەئێمە دیفاع ئەکەن ، لەمشکێك دیفاع دەکەن بەس لە ملیۆنان موسلمان دیفاع ناکەن .

کەواتە ئەم ئایەتە زۆر هەڵدەگرێ ﴿وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ﴾بەلێ ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە وە بۆ ئەوە نەهاتوە کەوا تۆ تەنها لەماڵێکدا دانیشی و لە کونجی مزگەوتێکدا دانیشی بەتەنها نەخێر تەنها بۆ ئەوە نەهاتوە لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وای نەکردوە .

*** ***

# برگەی شەشەم

(وقوله : ﴿ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ﴾) ئینجا لەم برگەیەدا تەئەکید ئەکاتەوە الله تعالی دەفەرمووێی :

(﴿ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ﴾)بزانن (رب) لێرەدا بەمانای ئەوەیە (أي : هو المعبود) کەلیمەی (رب و إلاه) لەزمانی عەرەبیدا ئەگەر پێکەوە هاتن ئەوە هەر یەك مانایەکان هەیە بەڵام ئەگەر هەر یەکەو بەتەنها هاتن ئەوە هەردووکیان هەردوو مانا دەگەیەنن واتا هەریەکەیان مانای ئەویتریشیان دەگەیەنێ .

رب: بەمانای دروستکار و بەخێو کەر و مالیك و بەمانای پەرستراویش دێت بەتەنها ئەگەر خۆیی هات ، لەناو گۆردا پێت ئەوترێی ؟! (من ربك) ئایا ئەبو جەهلیش ئەتوانی ئەمە جواب بداتەوە ئەگەر (رب) بەس بەمانای خالق بێت !؟ ئەگەر بەتەنها ئەو مانایە بدا ئەتوانی وەلام بداتەوە چونکە ئەویش دەیفەرموو (﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَهُمۡ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾)[1] کێشەیان نەبوو لەگەل ئەوەدا بەس (من ربك یعني من إلاهك) تۆ کێت ئەپەرست و بەقسەی کێت ئەکرد ؟! لێرەدا رب بەمانای ئیلاهە .

جا لێرەدا کە دەفەرمووێی : (﴿ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ﴾) یانی الله تعالی معبودی ئێمە و ئێوەشە بەس کە ئێمە کاتێك کە دەیپەرستین ئەوە ئەرکی خۆمان جێ بەجێ ئەکەین بەس وەکو عەبدایەتی ئێوە کە نایپەرستن ئەوە ئێوە موشریکن کە بەتەنها نایپەرستن ،

إبن کثیر دەفەرمووێی : (أي : هو المعبود ، لا إله غیره ، فنحن نقر بذلك اختیارا)ئێمە بەئیختیاری خۆمان ئیعتراف دەکەین بەوەی کە الله تعالی پەرستراوی ئێمەیە ، (وأنتم وإن لم تفعلوه اختیارا)ئێوە ئەگەر بەئیختیاری خۆشتان کە عیبادەت ناکەن کە ئیختیارتان ئەوەیە کەوا نایکەن ، کە بەتەنها الله تعالی ناپەرستن بەلکو الله و غەیری الله تعالی ش ئەپەرستن ، (فله یسجد من في العالمین طوعا واختیارا .)هەرچی لەعالەمی من ادا هەیە سجدەی بۆ ئەبات

[1] :سورة الزخرف ، اية : ٨٧.

بەخۆشی بێت یاخود بەناخۆشی ، یانی شەیطانەوە بگرە هەتاوەکو ئاخیرکەس کە ئەوپەری مولیحید بێت ئەتوانی لەئاستی قودەرتی الله تعالی دا هیچ بکات ؟! نەخێر ناتوانی .

*** ***

## برگەی حەوتەم

(وقوله : لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ ) جەزای ئەعمالەکانی خۆمان بۆخۆمان وە جەزای ئەعەمالەکانی خۆتان بۆخۆتان .

ئینجا لیرەدا إبن کثیر قسەیەکی زۆر جوان دەهێنی ئەفەرمووێی : (أي : نحن برآء منكم)ئەوە بەرائەتە وە ئەوەش کافر کردنی ئەوانە ، کە الله تعالی دەفەرمووێی : بلێن : عەمەلی خۆمان بۆخۆمان وە عەمەلی خۆتان بۆخۆتان ئەمەیانی ئێمەی موسلمان الله تعالی إن شاء الله لەسەر ئەم تەوحیدە پاداشتمان ئەداتەوە وە ئێوەی موشریك و کافریش الله تعالی لەسەر ئەو شیرك و کوفرە الله تعالی ئینتقامتان لێ ئەسێنێ .

(کما قال تعالی : (وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمۡ عَمَلُكُمۡۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعۡمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ٤١)[1] ئەگەر بەتۆیان وت درۆ ئەکەی تۆ پێغەمبەر نیت (فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمۡ عَمَلُكُمۡۖ ) عەمەلی خۆم بۆخۆم وە عەمەلی خۆتان بۆخۆتان، تەوحید و ئیمان بۆخۆم وە جەزاکەی بۆخۆم وە شیرك و گومرایی و عاقیبەتەکەی بۆخۆتان (أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعۡمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ) من بەریم لەوەی ئێوە ئەیکەن لەو شیرك و گومراییە من بەریم لەئێوە .

---

[1] :سورة یونس ، ایة : ٤١.

پرسیارێك : بەریىء یانی چی ؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) کافری کردن ، الله تعالی دەفەرموویێ : (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ )[1] پێغەمبەری خوا (ﷺ)بەرائەتی کرد .

با سەیرێکی ئەمڕۆ بکەین بزانین کامە موسلمان بەرائەتی خۆیی لە کوفر و کافرین کردوە ، عقیدەیەکی ئیجرائی باطلی پیس بەسەر زۆربەی زۆری گەنجانیشدا نەك هەر پیرەکان زاڵ بووە کە دەڵێ : واللە من ناوێرم ئەوە کافربکەم ، کە کافر بوو ناوێرم چیە تۆ خۆت بەوە کافر کردوە ئەگەر کافر نەکەی !! بزانە ئەگەر کافر کافر نەکەی خۆت کافر ئەبیت ، واتا ئەگەر لێی بەریی نەبی ئەوە یانی تۆ موافقی ئەوی ی واتا تۆ موافقی کوفر بووی ئەوکاتە خۆت کافربووی ، ئێمە نالێن : ئەوانەی کە تەنها گوناه دەکەن کوفریان نەکردوە موسلمانن و موحید یەکخوا پەرستن برۆ کافریان بکە وەکو خەواریج نەخێر بەس دەڵێن : خاوەن کوفر وشیرك و گومرایی واجبە لەسەرت کافریان بکەی دەبێت تۆ بلێ من بەریم لێتان وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێرەدا پێی وتوە (لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ).

وە ئایەتێکیتر بێتەوە بەرچاوتان کە الله تعالی دەفەرموویێ : (إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ)[2] لەغەیری الله تعالی ئێمە بەرین لێتان یانی کافرن ئێوە لەبەر ئەوەی لەغەیری الله تعالی دەپەرستن بۆیە کافرن .

*** ***

[1] : سورة الكافرون .
[2] : سورة الممتحنة ، اية : ٤.

## برگەی هەشتەم

(وقوله : ﴿لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ﴾)لێرەدا بەو مانایە دێت کە (قال مجاهد : أي لا خصومة . قال السدي : وذلك قبل نزول آية السيف . وهذا متجه) یەك لەتەفسیرەکان ئەڵێ ئەوەیە کە : ئیمامی موجاهید دەفەرمووێ : نایەن شەرانگێزیتان لەگەلدا بکەین کاری خۆمان بۆخۆمان وە کاری خۆتان بۆخۆتان ، سدی دەفەرمووێ : ئەوە پێش دابەزینی ئایەتی سیف و قیتال بووە .

تەبعەن یەکێك لە بەناو فەیلەسوفەکانی بەناو بانگخوازی ئیسلامی موسلمان ئەمرۆ گوێمان لێ دەبێت دەلی : کاکە بەتوند و تیژی نابێ وەرم بۆم بێنن بزانم یەك کەلیمەی سیف لەقورئاندا هەیە ؟! ئەوەندە بێ عەقلە وەکو ئەوە وایە کە هیچ عەرەبی نازانی ئەی قیتال بەچی ئەکرێ ئەی بێ عەقل !! خۆ قیتال بە پەنجە ناکرێ ئەی هەر بەشمشێر نەکراوە !! ئەویش دێت و دەلێت : یەك سیف باس نەکراوە لەقورئاندا ! ئەوەتا زانایان ئایەتی قیتالیان ناو ناوە بەئایەتی سیف ، زۆر سەیرە دەلێ : ئیسلام ئەوەندە نەرم و نیانە هەر سیفیکیشی تێدا باس نەکراوە لەقورئاندا !! دیارە زۆر بێ عەقلە لە تێگەیشتنی قورئان و زمانی عەرەبی ئەو واقیعەی کەپێغەمبەری خوا (ﷺ)تێدابووە ، ئەی لەبەدردا بە دار شەریان کرد ؟! یان بەئاو ؟! یاخود بەشمشێر و بەرم و بەتیر بە ئەنواع و ئەشکالی کە پیاوی خۆیی دەوێ ئەو پیاوە نیە ئەو شەرە بکا ، کە دەمانچەیەکی پێی یان نەوەوییەکە بەترسنۆکانە پەنجەیەکی پێدا ئەنێ عەشیرەتێك و شارێك و ولاتێك و دونیایەکت بۆ کاول ئەکات !! .

إبن کثیر دەفەرمووێ : (وهذا متجه لأن هذه الآية مكية)ئەمە دەکرێ بلێن : وایە لەبەر ئەوەی ئایەتەکە مەککیە ، (وآية السيف بعد الهجرة .)وە لەدوایدا ئایەتی سیف هاتۆتە خوارەوە کە دەفەرمووێ : (﴿لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ﴾).

تەبعەن زانایتر بەشێوەی تر تەفسیری کردوە و دەلێت : بەمانای ئەوە دێت کە ئیتر پێویست بە موناقشە ناکات ئیتر تەواو کەسێك کە عینادی کرد ئیتر لێ گەرێی تەواو و کۆتایی پێ بهێنە ، دواتر ئەگەر لەوزعێکدا ئینسان ژیا بەدەسەلات و تاوان بوو ئەوەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی

فەرمووە هەتاوەکو بەرامبەر بە یەهود و نەصارا وە بەرامبەر بە موجوس کە ئەم سێ یانە حوکمی ئەهلی کیتابیان لەسەردا جێ بەجێ ئەکرێی وە گرۆیی مجوسیش لە لەبوخاریدا هاتوە کە ئەوانیش حیسابی ئەهلی کیتابیان لەگەلدا ئەکرێی کە جزییەیان لی سەنراوە ، ئا ئەمانە پێیان دەوترێی : یان موسلمان بن ئەوە ئەوکاتە وەکو موسلمانان وان ، یاخود جزییە بدەن بەڵام بەزەلیلی (حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ )[١] یاخود قیتالتان لەگەلدا ئەکەین .

بەلام ئەما یەکێك هەلگەرێتەوە (مورتەد )بێتەوە لەدینی الله تعالی لەناو موسلماناندا یاخود کەسانێك بەناوی عەلمانیەت ئێستا ئەوروپا ئایا زۆر بەی زۆری ئەوروپا ئەهلی کیتابە ؟! نەخێر ئەهلی کیتاب نیە لەبەر ئەوەی تبرودیان لەسەر دینەکەی خۆیان کرد لەسالی ١٧٠٠ەکاندا کەنیسە و پاپا و قەشەیان کۆکردەوە و فریاندان بەحیسابی خۆیان خستیانە زبلدانی تاریخەوە برویان بەخوا و دین و هیچ شتێك نەما ، کەواتە ئەمانە حیسابی ئەهلی کیتابیان بۆناکرێی بەلکو ئەوانە مولحید و کافری موعانیدن ،ئەهلی کیتاب ئەوەیە کە تەوارت و ئینجیل بەدەستەوە رابگرێی و ئەپارێتەوە وەکو الله تعالی لەقورئاندا باس دەکا ئینجا لێشی قبول ناکرێی ئەوەیان ئەهلی کیتابە .

*** ***

[١] :سورة التوبة ، اية : ٢٩.

## برگەی نۆیەم

(وقوله: ﴿ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ﴾ ) الله تعالى ئێمە هەموو کۆدەکاتەوە ئەمە هەرەشەیە لەرۆژی قیامەتدا الله تعالى هەموومان کۆدەکاتەوە ، (أي : يوم القيامة)، (کقوله : ﴿قُلۡ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفۡتَحُ بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَهُوَ ٱلۡفَتَّاحُ ٱلۡعَلِيمُ﴾)[1] تۆ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ)ئەگەر ئیمان نەهێنن بەو دین و ئیمانەی ئێمە بەتەنها و تەنها بەو قورئان وبەو ڕێبازەی کە من هێناومە وە دەبێت تەنها من رسولی الله بم وە نابێت شوێن کەسیتر بکەون ئەگەر بەم شێوەیە بوو ئەوە زۆر باشە ئەگەر وانەبوو ئاگاداربن الله تعالى کۆمان دەکاتەوە لەرۆژی قیامەت دواتر (﴿ثُمَّ يَفۡتَحُ﴾)یانی (یحکم)یانی الله تعالى حوکم ئەکات لەنێوانماندا (﴿بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ﴾)وە حەقەکە ئەسەپێنی بەسەرمان ئەهلی دین و تەوحید و یەکخوا پەرستی بۆ بەهەشت ، وە ئەهلی شیرك و گومرایی بۆ جەهەنەم ، (﴿وَهُوَ ٱلۡفَتَّاحُ ٱلۡعَلِيمُ﴾) یانی خۆیی حاکمێکی زانایە .

*** ***

## برگەی دەیەم

(وقوله : ﴿وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ ) واتا هەموومان بۆلای ئەو دەگەرێنەوە ،( أي : المرجع)بەمانای (رجوع)یانی ئەگەرێنەوە بۆلای الله تعالى ، (والمآب يوم الحساب .)ئەمە کۆتاییەکەیەتی .

ئێمەش ئێستا بە قەومەکەی خۆمان ئەڵێن : والله لەدلسۆزی ئێمەیە بۆ ئێوە ئەی قەومەکەمان ، هەر ڕێبازێکیتان گرتوە ئێوە بەرەلای بکەن تەنها ڕێبازی ئیسلام و ڕێبازی دینی پێغەمبەر محمد (ﷺ) نەبێت ئەگەر نا زەرەر دەکەن بەگەورترین زەرە ، ئێستا ئێوە چی لەئێمە ئەکەن ئەمان کوژن وسجنمان ئەکەن و لێمان ئەدەن پارچە پارچەمان ئەکەن وەکو دەبینین کە ئێستا

[1] :سورة سبإ ، اية : ٢٦.

چەند سالە موسلمان پارچە پارچە ئەکرێی کێشە نیە ئەروات و ئەبڕێتەوە و کۆتایی پێ دێت بەڵام لەکوێدا کۆدەبینەوە هەموومان ؟! لەرۆژی قیامەت ئەگەرپیاوی لەرۆژی قیامەت سەر هەلبرە بەرامبەر ئەو خوایە و لەوێشدا تۆ خسومەت لەگەل الله تعالی دا بکە و بلێ من هەر ئاراء و ئەهوای خۆم بەرز دەکەمەوە ئەگەر پیاوی لەوێدا بیکە ، جا ئێمە بەو رۆژە ئێوە و خۆمان ئەترسێنین بەم شێوەیە ئێمە لەگەل خەلکی قسە ئەکەین ، ئێمە تەماعی دونیاو پارە و سەروەت و سامان و عەرشەکەیتان نیە ئێمە تەنها ئەوە دەلێین : ئێوە خزمەتی الله تعالی بکەن وە خزمەتی دینی الله تعالی بکەن وە بەدینی الله تعالی حوکم بکەن ئێمە خزمەتکارتانین وە ئەگەریش نایکەن ئێمە ئەو عیبارەتە بەکار دەهێنین ، مامۆستایانی ئاینی خێریان تێدا نیە ئەگەر ئەم حەقە بلاو نەکەنەوە وە حوکماتیش خێریان تێدا نیە ئەو حەقە جێ بەجێ نەکەن .

هیچ مامۆستایەکی ئاینی خێری تێدا نیە ئەگەر ئەو حەقە نەلێ وە هیچ حوکمەتێکیش لەسەر ئەم زەمینە خێری تێدا نیە ئەگەر خۆیی بەموسلمان ئەزانی ئەگەر ئەو حەقە جێ بەجێ نەکات .

(وصلی الله علی نبینا محمد وعلی اله وصحبه أجمعین)

❊❊❊ ❊❊❊